


الرسالة

# پەیام

سالی یەکەم ـ ژمارە هەشت ـ مانگی شەعبان/ ١٤١٥



بڵاوکراوەیەکی مانگانەی ئیسلامییە ناوەندی ئیسلامی بۆ دیراساتی شەرعی دەری دەکات

# ئامانجەکانی ئەم بڵاوکرایەوە

١ - بڵاوکردنەوەی ئەو عەقیدە پاکەی کەسەلەفە سالحەکان لەسەری بووینە.
٢ - بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی.
٣ - پەرەپێدانی بیرو هۆشی ئیسلامیانەی موسڵمانان.

# پەیام ——— ٨

## بسم الله الرحمن الرحيم

## الذين يبلغون رسالات الله ويخشونه ولا يخشون احداً الا الله وكفى بالله حسيباً.

(احزاب ٣٩)

**بابەتەکانی ئەم ژمارەیە**

# قورئان و سوننەت

## لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا

«وما اختلفتم فيه من شئ فحكمه الى الله...» شورى (١٠)

ئەم ئایەتــە ئەوەمان فەرمان پێ دەکات کە ئەگەر خەڵك لە حوکمی هەر مەسەلەیەکدا ناکۆکیو دووبەرەکی یان کەوتە نێوان، پێویستە بگەڕێنەوە سەر حوکمی خوداو، پشت لەهەر حوکمێکی دیش بکەن و ڕەتی بکەنەوە. ئەمە لەسەر هەموو موسڵمانێکی خواناس واجبە.

ئەوەی خۆی بە موسڵمان دابنێ دەبێ زۆر سوور بێ لەسەر ئەم مەسەلەیە، وە زۆر ئاگادار و وریاش بێ، نەوەك تێ بکەوێو متمانە بکاتە سەر حوکمێکی غەیری قورئان و سوننەتی، بە تایبەتی لەم کۆمەڵگە نەفام و دوور لە حوکمی خوایەدا، کە بە هیچ شێوەیەك گیروگرفت و کێشە و دۆخەکانیان بە گوێرەی قورئان و سوننەت چارە ناکەن.

خوای گەورە چۆن ئەگەر یەکێك لە گەڵ عیبادەتی خوا یەکێکی دیش بپەرستێ بە شرکی داناوە، وەکو دەفەرموێ ﴿فمن كان يرجو لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه احدا﴾ کهف (١١٠).. ئاواش ئەوەی بە شرك داناوە ئەگەر یەکێ کار بە غەیری حوکمی خوا بکات. وەکو دەفەرموێ:- ﴿ولا يشرك في حكمه احدا﴾.

مرۆی موسڵمان هەموو شتێکی بۆ لە قورئان و سوننەت ڕوونکراوەتەوەو پێویستی بە حوکمی ئەم لاو ئەولا نی یە. حەرام و حەڵاڵی بۆ ڕوون کراوەتەوە، باش و خراپ و پیسی و پاکی بۆ لێك جیا کراوەتەوە.

موسڵمان دەبێ ئەوەی لە لادا عەقیدە بێ کە حەڵاڵ ئەوەیە کە خواو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە حەڵاڵیان داناوە، حەرام ئەوەیە کە خواو پێغەمبەر حەرامیان کردووە، دینی ڕاست و هەق ئەو دینەیە کەخوا بۆ ئێمەی ناردووە، شەریعەت ئەوەیە کە خوا بە شەرعی داناوە.

ئەوەی لە لادا عەقیدە بێ کە هەر شتێ خوا حەرام و حەڵاڵی نەکردبێو، هەموو دین و مەنهەج و شەریعەتێکیش لە غەیری هی خوا، ئەوا هەموویان بە تاڵن و دەبێ هەمووی ڕەت کاتەوە.

موسڵمان نابێ عەقیدەی وابێ کە ئەم حوکمە لە حوکمی خواو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باشترەو شایەنتری کارپێکردنە چونکە ئەم جۆرە عەقیدەیە کوفرەو کابرای پێ کافر دەبێ. وە ئەم جۆرە عەقیدەیە بەهیچ شێوەیەك ڕاستی لێ وەدەر نایێت، چونکـە حوکمی خوا لە هەمـوو حوکمێك باشترەو هەر حوکمی خواشە شایەنی کارپێکردنە وەکو دەفەرموێ ﴿.. ذلك خير لكم واحسن تأويلا﴾.

ئینجا با بێینە سەر ئەوەی داخوە حوکم دانان شایانی کێ یە؟

حوکم دانـان شایانی ئەو کەســەیە کە دەبێ چەندین سیفەتێکی لێ بێتە جێ، بێ گومان ئەو سیفەتانەش تەنها هی خوای پەروەردگارەو، غەیری خوا ئەم سیفەتانەیان لێ نایەتە دی، فەرموون ئێوەو هەندێ لەم سیفەتانە:

١ ـ خوایەتی و پەروەردگاریتی: ئەوەی حوکم دادەڕێژێ دەبێ خوای خەڵك بێ، خالقی بوونەوەر بێ، موڵکی ئەرزو ئاسمانەکان هی ئەو بێ، پەروەردگار بێ، بوونەوەر گەرەکداری ئەو بێ، خۆیشی گەرەکدارو موحتاجی هیچ شتێ نەبێ.

بێ گومان ئەم سیفەتانەش لە هیچ کەسێکی غەیری خوا نایەتە دی، وەکو دەفەرمووێ: ﴿هو الذي في الارض اله و في السماء اله﴾، ﴿له الملك و له الحمد﴾، ﴿خلق الموت والحياة ليبلوكم﴾، ﴿الله الصمد﴾.

٢- زانینی غەیب؛ بە رووداوو روونەداو، بە دیارو نادیار، بە رابردوو و داهاتوو، بەنهێنی و ئاشکرا، بە ووردو درشتەکان، بە هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە زانیار بێ و هیچی لێ وون نەبێ، هیچ شتێکی لە بیر نەچێ، بێ گومان ئەم سیفەتانەش بە تەنها هی خودایە و بەس. وەکو دەفەرمووێ: ﴿عالم الغيب و والشهادة﴾ ﴿يعلم ما تسترون وما تعلنون﴾، ﴿والله بكل شيءٍ محيط﴾ ﴿إنّ ربي لايضل ولا ينسى﴾.

٣- بەرژەوەندی بەهیچ چینێکی مرۆڤایەتی یەوە نەبێ، بێ گومان هەر خوایە بەرژەوەندی و قازانجی نەك لە مرۆڤ بەڵکو بە هەر شتێکی دی غەیری خۆی نی یە، وەکو دەفەرمووێ: ﴿والله غنيّ عن العالمين﴾.

بەلام هەر چینێکی مرۆڤایەتی گەر یاسادارێژ ێ ئەوا مەحاڵە بتوانی بەرژەوەندی چینە هاوشێوەکەی خۆی بەلاوە نێ و لەسەر بنچینەیەکی بێ لایەنانە یاسایەکان دارێژێ.

هەر میللەتێك یاسا دارێژێ، ئەوا رەچاوی قازانج و بەرژەوەندی میللەتەکەی خۆی دەکات و بەرژەوەندی گەل و میللەتانی دیکەش بەلاوە دەنێ هەر کەسێ یاسا دارێژێ، شتێکی حەتمی یە دەبێ رەچاوی بەرژەوەندی و قازانجی خۆی و بنەماڵەو خزم و دارو دەستەکەی بکات.

بۆیە لەکۆتایی دا دەڵێین بەهیچ شێوەیەك رێی تێ ناچێ مرۆڤ ببێتە دارێژەری حوکم و یاسا، چونکە گەر وابێ مرۆڤایەتی تووشی وێران و کاولکاری دەبێ و زوڵم و چەوسانەوەو نادادگەری و پشێوی بەرپا دەبێ.

ئینجا با روویکەینەوە حوکمی خواو پشت لە حوکمی غەیری خوا بکەین و هەموو یاساو مەنهەجێکی نا ئیسلامی رەت بکەینەوە.

## لەژێر تیشکی فەرموودەدا

### شەیتان هەوڵ لە یەککردنی موسڵمانان دەدات

جابیر - رەزای خوای لێ بێ - دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو ﴿انَّ الشيطانَ قَدْ يَئِسَ أنْ يعبدَهُ المصلّون في جزيرةِ العرب، ولكنْ في التّحريش بينهم﴾. رواه مسلم.

يئس: بێ هیوابوو، هومێدی لێ دانا.

التحريش: لە یەککردن و نانەوەی دووبەرەکی و پەرتەوازەیی.

شەیتان ئەو دوژمنە سەرسەختەی مرۆڤ لەو کاتەی فەرمانی خوای شکاند و سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد و لە عنەتی لێکرا، سوێندی بەخوای عزوجل خوارد کە تا دونیا مابێ دەبێ هەوڵی لەخشتە بردنی موسڵمانان بدات و لەراستە رێێ ئیسلامیان لابدات و بیانخاتە سەر کوێرە رێی کوفرو نەفامی - شەیتان بۆ ئەو مەبەستە بەدوای نزیکترین و کاریگەرترین رێگا گەراوەو، زانیوێتی لە یەککردنی موسڵمانان رێگایەکی لەخشتەبەرە بۆیە کردوویەتیە پیشەو کاری خۆی.

بەلام موسلمانی تێگەیشتوو ئەوکەسەیە وەبەر ئەم شالاوە شەیتانیە نەکەوێ و هەوڵی شەیتان پووچ کاتەوە، وانەکات خۆی لە موسلمانان جوێ کاتەوەو ببێتە هۆی چاندنی تۆوی دووبەرەکی.

زۆر جاران موسلمانی واهەیە بەڵگەی ئەم بەناو فەرموودەیە دێنێتەوە کە دەڵێ: ﴿اختلاف أمتي رحمة﴾ فەرموودەیەکی مەوضوعە - بۆ ئەوەی هەنجەت و بیانوویەکی شەرعی!! بۆ دووبەرەکی موسلمانان بدۆزێتەوە، بێ گومان ئەم دۆزینەوەی بیانووەش خۆی لە خۆدا یەکێکە لە فێڵە هەڵخەڵەتێنەرەکانی شەیتانی مەلعون.

ئێمە چەندین ئایەت و فەرموودەمان فەرمانە کە یەکپارچەیی و یەك کۆمەڵی خۆمان بپارێزن و پەتی نێوانمان نەبچڕێنین. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿واعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا﴾

﴿ولا تكونوا كالذين تفرقوا وكانوا شيعاً﴾، ﴿ولاتنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم﴾.



ئەگەر بەووردی لە مەسەلەکان بکۆڵینەوە، بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو ئیختیلاف و دووبەرەکی یەی ئەمڕۆ لە ئارایە، بەڵێ هەندێکیان لەسەر حەق و ناهەقن بەلام زۆریشیان بۆ چەند مەسەلەیەکی شەخسی دەگەڕێتەوە، هۆیەکانیشی یان بەهیچ نەزانینی لایەکە بۆ لایەکەی دی، یان پایەویستی (حب المنصب)ە. یان خۆ بە گەورە زانین و بەرامبەر بە کەم زانینە، یان ڕق و کینەیە، یان ئیرەیی و حەسوودییە، یان چەند مەسەلەیەکی لەم جۆرانەیە!!

ئەنجا کە ئەو ئیختیلافەشیان تێ کەوت، هەر خوا دەزانێ چۆن و بەچی تانەو تەشەر لەیەکتر دەگرن، ئیدی گوێ بە غەیبەت و زەم و نەمیمی نادرێ، کوفرو نەفامی و دوژمنانی ئیسلام و موسلمانان دەخرێنە گۆشەی فەرامۆشەوەو هەر حیسابیشیان بۆ ناکرێ. مەگەر ناوەناوە بەیادیان بێتەوە!!.

خۆ سەحابەکانیش ناوەناوە ئیختیلافیان تێ کەوتووە، بەلام نەبوونە هۆی ئەوەی ئەم بەرەیەك و ئەوەی دیش بەرەیەکی دی دروست بکات و زەم و غەیبەت دەست پێ بکەن و لە پەناو پەسێوان دا باسی یەکتر بەخراپە بکەن. چونکە ئەوان هەردەم بەرژەوەنەی گشتی موسلمانانیان لەبەر چاودا بووە، قەت ڕێ یان بۆ شوێن پەنجەی دوژمنانیش خۆش نەکردووە گری دووبەرەکی برەو پێ بدەن ئەوان هەردەم شتی شەخسی و دەستکەوتی تاکە کەسی یان بە لاوە ناوەو هەر بیرشیان لێ نەکردۆتەوە. لە حەقیقەتدا ئەو ئیختیلافەی لەنێوانیان ڕوویداوە هەمووی لە پێناو شتی شەرعی دابووە، بۆیەش بە ئادابی شەرعی ئیختیلافەکەیان بەرێوە بردووە تا ئەو کاتەی نەیانهێشتووە.

جا بۆ ئەوەی دووبەرەکی و ناتەبایی لەنێو خۆماندا بنەبر بکەین و هەوڵدەین پارچە پارچەیی موسلمانان نەمێنێ، با ئەم چەند خاڵە لەبەر چاو بگرین و لێ یان بێ ئاگ نەبین.

١- ڕیشەکێش کردنی حەزو ئارەزووی پلەوپایە دارێی لەدڵ و دەروون دا: بێ گومان ئەم سیفەتە ناپەسندە هۆکارێکی زۆرکاریگەرە بۆ ئەوەی وا لە کابرا بکات لەسەر بیروڕای خۆی نەیەتە خوارەوەو ڕای براکانیشی بکاتە قوربانی ئەمەبەستەکەی.

٢- حەسوودی بە یەکتر نەبردن: حەسوودی بەم جۆرە جائیز نی یە ئەگەر یەکێ بەهرەیەکی هەبێ یان خاوەن شتێکی نایاب بێ، ئەویش حەز بکات بەهرەکەی نەمێنێ و لە دەستی بچێت.

بەلام ئەگەر حەز بکات ئەویش وەکو بەهرەدارەکەی لێ بێ بۆ ئەوەی بتوانێ لەرێگایەکی چاکەکاری بەکاری بهێنێ جائیزەو پێشی نالێن حەسوودی بەلکو پێی دەلێن خۆزگەپێ خواستن (غبطة).

٣ـ خۆشویستنی یەکتر و رق هەڵنەگرتن لە یەکتری: بنچینەی برایەتی و یەکتر ناسینی ئیسلامی لەسەر خۆشەویستی سۆزو بەزەیی یە، خۆشویستنی یەکتری بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان ﴿ولا تؤمنوا حتىٰ تحابوا﴾ رواه مسلم رق هەڵگرتن لەیەکتری دەبێتە مایەی وەرنەگرتن و گرنگی پێ نەدانی رای بەرامبەر بەڵکو دەبێتە بێزراندن و رەت کردنەوەی ئەگەر چی رایەکەش پەسند و لەجێ بێ. بەڵام یەکتر خۆشویستن دەبێتە مایەی گرنگی پێدان و گوێ گرتن بۆ رای بەرامبەر، ئینجا ئەگەر راکانیش جوێ بن ئەوا دووبەرەکی و پەرتەوازەیی روونادا.

٤ـ دووزمانی نەکردن: بێ گومان دووزمانی (نەمیمی) یەکێکە لە گوناهە گەورەکان و موسڵمان دەبێ خۆی لێی بپارێزێ.پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ ﴿لایدخل الجنة نمام﴾ رواه مسلم.

٥ـ لەبێژنگ دانی و هەڵنرخاندنی هەواڵ و قسە: ئینجا ئەگەر سوود بەخش بێ ئەوا رایگەیەنینە موسڵمانان، وە ئەگەر زیانبەخش بێ ئەوا بڵاوی نەکرینەوە لە نێوی بەرین. ئەوەتە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەم فەرموودەیەدا ئەو کەسەی بە درۆزن داناوە کە بەبێ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە ـ بێ ئەوەی راست و درۆی قسەکە سۆراخ بکات ـ یەکسەر دەیلێتەوە ﴿کفى بالمرء کذباً أن یحدّث بکلّ ماسمع﴾ رواه مسلم خواش دەفەرموێ: ﴿یاءایها الذین آمنوا إن جاءکم فاسق بنباءٍ فتبیّنوا﴾ حجرات.

٦ـ بنەبر کردنی غەیبەت و داپۆشینی عەیبی موسڵمانان. نەك بڵاوکردنەوەو تانەوتەشەر لێ دانی. چونکە ئەو پرت و بۆڵەیەی لەم لاو لەولا لەیەکتر دەکرێ دەبێتە هۆی گۆرینی بۆچوونی بینەرەکە لەبەرانبەر کابرای غەیبەتکراو و لەبەر چاو کەوتنی. کە بەمەش تۆوێکی دووبەرەکی لەدڵی بیسەردا دەچنرێ.

٧ـ ریشەکێش کردنی سیفەتی تەکەبوری و خۆ بە بەرزترو بە گەورە تر گرتن واتە هەرگیز هەق و راستی رەت نەکەینەوەو شتی خەڵکیش بەکەم و بێ نرخ نەگرین، وەکو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەبارەی «الکبر»دا فەرموویەتی ﴿الکبر بطر الحق وغمط الناس﴾ رواه مسلم.

# عەقیدە

## دۆستایەتی کردن و دژایەیەتی کردن

ئەوانەی کە خوای گەورە رێنموونی کردوون بۆ ئەم ئاینە گەیشتنە ئامانج و مەبەستەکانیان، کەلایان خۆشەویست ترە لە خۆیان و ماڵ و منداڵ و دایك و باوکیان.

لەسەردەمی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەلان (خ.ر) ئەو فەرموودەیە هاتەدی کە دەفەرموێ ﴿تری المؤمنین في تراحمهم و توادهم وتعاطفهم کمثل الجسد اذا اشتکى منه عضو تداعى له سائر جسده بالسهر و الحمى﴾ البخاري.

چ وێکچوونێك لە نیوان کۆمەڵگایەکی ئیسلامی و، تاکە لاشەیەکی مرۆڤ لەم وێکچوونە پتەوو هورد بین ترە.

هەر کاردانەوەیەك بەرامبەر نۆرەیەکی ئێش و ئازار لەلاشەیەك دا بەشێوەیەکی لە خۆڕاو خێرا دەبێت و، هەر بەردەوامیش دەبێت، هەر تاکو ئەندامە ناساغەکە، ئێش و ئازاری هەبێت.

ئەوەیە کۆمەڵگای ئیمانداری موسڵمان. کە خۆشەویستی و سۆزو رەحم بەیەك کردن تیایدا، بەنیشانەی ئیمان و بەشێك لەراستی ئیسلامەکەی دادەنرێت. ئەمە بە یەك گەیشتنەوە راستەقینە کەیە لە نێوان تاکەکانی ئوممەتی ئیسلامە. ئەو ئوممەتەی کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دایمەزراندو لەپاش ئەمیش خەلیفەکانی دەستیان پێوەگرت و پاراستیان. ئەم بەیەك گەیشتنەوەیەش، بارێکی بەهێزو ناوەزەی بۆ موسڵمانان بەجێ هێشت. کەسەدان ساڵ بەردەوام بوو. بۆیە هەر کاتێك کارەساتێك تووشی بەشێکی موسڵمانـان دەبوو، تێکرای کۆمەڵگا موسڵمانەکەی پێ دەوروژاو خەمیان لێ دەخواردو، سەروماڵ و کاتی خۆیان لەپێناودا دەبەخشی و، تەنانەت چێژی حەسانەوەیان نە دەکرد، تاکو کارەساتەکە بەسەر دەچوو و کۆتایی پێ دەهات و ئەو بەشە ناساغەی چاك دەبووە. بەتەواوی هەروەکو لاشەی تاکەکەسێك.

جا ئەو هەڵس و کەوت و هەڵوێستە، زۆر رقی دوژمنانی ئیسلامی هەڵدەستاندو دەیتۆقاندن. لەبەر ئەوەی خۆیان لەبەرامبەر ئوممەتێکی بەهێزوپتەودا دەدیتەوە، کە داکۆکی لەبەشێکی بچووکی خۆی دەکرد بەهەمان شێوەی کە داکۆکی لە هەمووان دەکردو، هەر کارەساتێکیش بەسەر بەشێکی دابهاتبا هەموو بەهی خۆیان دەزانی بەلام ئەم سیفەتە ناوازەیەکی ئوممەتی موسڵمانی جیا دەکردەوە لەوانی تر، لەلای هەندێ لە موسڵمانان بێ هێزو لاواز ببوو، لەلای زۆربەشیان بەتەواوی حەیاتی لێ برا. ئەمـەش کاتێك بوو کە ئوممـەتەکە تووشی ئیفلیج بوونێکی کەونار ببوو، لەئەنجامی ئەو نۆرە بەنجانە بوو کە دوژمنان دەیانکردە لاشەیەوە، بووە هۆی نەمانی هەست بەیەکدی کردن لە نێوان تاك و چینەکانی دا.

ئەم کردارانەش بەئۆینی رۆژ ئاواو رۆژ هەلات بوو، کە چاویان بریبووە وولاتی موسڵمانان، چونکە سەرچاوەی پەیامێکی نەمرەو، گرنگترین چاوگەکانی سامانی تیدایە لە جیهاندا. ئاواتەکانیشیان تێدا نەدەهاتەدی، ئەگەر تۆوی ناکۆکی جودایی یان لە نێوان موسڵمانان دا نەچاندباو، گیانی دوستایەتیان لە نێوان لاواز نەکردبا.

● ئەوە بوو رۆژ اوا بەتیۆری (نـظریە) ماددەپـەرستی و هەوەس (الشهـوة) و ناووشـۆرەت بۆمـان هاتنەمەیدان. بۆ ئەو شتانە دوستایەتی دەکرێ و لەسەر ئەوشتانەش دژ ایەتی دەکرێ. لەو تیورەدا ماڵ و سامـان تاکـە بزوێنەری خوشەویستی و رقی مرۆڤن بەرامبەر کۆمەڵگای سەرمایەدار. پەتای ئەم نەخۆشی یە کوشندەو بیرە فەوتینەرانە لەئەنجامی تیکەڵاو بوونە لەگەڵ کافران لەسەر بنچینەو بۆچوونی نا ئیسلامی یانە.

● هەروەها پەتای بیری کومۆنیستی (الشیوعیة)ش دزەی کرد بۆ ناو مان هەر تاکێکیش لە کۆمەڵگای شیوعی دا مل کەچـە بۆ رژێمی فەرمانڕواو بەم پێ بەش دەبێتە کۆیلەیەکی دەوڵەت و، ئامێرێکی کەرولاڵ لە دەستی دەوڵەت دا. بەبێ ویستی خۆی دەبێ مل-بۆ کەچ کاو. بە خورتیش دژ ایەتی دوژمنانی دەوڵەتی پێ دەکرێ. ئەم بیرەش تارادەیەکی زۆر لەناو وولاتە ئیسلامی یەکان بلاوبۆوەو، زۆربەی موسڵمانان وایان لێ هات کە بۆ دەوڵەت، یان بۆ حیزبی فەرمانڕەوا، یان بۆ سەرکردەیەك، مل کەچی کوێرانەیان هەبێت. جا یان لەپێناو بەرژەوەندی گشتی، یان لە ترسی هێزی دەسەلاتداران و تۆغیانی ستەمکاران. زۆربەی موسڵمانانی ئەمرۆ ئەرکی دۆستایەتی و دژ ایەتی یان لە پێناو خوا پشت گوی خستۆوە. چونکـە بەتـەواوی دابـراون لە ئاینـەکەیان و ئەرکەکانی لە خوشەویستی و رق و دۆستایەتی و دژ ایەتی.

زۆر لە موسڵمانـان پلەوپـایەو ماڵ و سامان، لە دۆستایەتی و دژایەتی لە پێناو خوای گەورەدا. خەریکی کردوون. وایان لێ هاتووە کە دۆستایەتی و دوژمنایەتی یان لە پێناو ئەو شتانە رێك دەخەن، چەند ناکۆکی و دوژمنکاری و شەڕوگاڵەمان بەرچاوان کەوتووە، لە نێوان خزم و دۆستاندا، لەسەر ماڵی دونیا.

● کۆمـەڵێکیش هەن کە دۆسـایەتی بەد رەوشتـان و دژایەتی رەوشت بەرزان دەکـەن. ئەمـانەش کۆمەڵێکن کە هەواو هەوەس دەپەرستن.

● سێیەم کۆمەڵیش زۆر لەو دوو کۆمەڵەی دیکە ترسناك ترن، کە ئەوانە یاریو وەرزشیان کردۆتە خواوەندێك جگە لە خوا دەیپەرستن و دۆستایەتی و دژایەتی یان هەر لە پێناو ئەو شتانە دایە. چونکە هەنـدێ هەن وەرزش و وەرزشوانانیان (بەتایبەتی تۆپانێ) لە خواو لە پێغەمبەر رولەئیماندارن زێتر خۆش دەوێن، ئەوەش بەشیرکی گەورە حسیب دەکرێ. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ومن الناس من يتخذ من دون الله اندادا يحبونهم كحب الله والذين آمنوا اشد حباً لله﴾ البقره - ١٦٥.

رەنگەهەندێك وڵێ پێگەن ئەو چەند قسەیە هێرشە بۆ سەر وەرزشکاری و لێ کەم کردنەوەیەتی. بەڵام راستی ئەوەیە کە ئیسلام دژی وەرزشکاری نی یە. وەك شێوازێکی بەهێزکردن و بێزازکاری (تهذیب). بەڵام دژایەتی ئەگەر ببێتە ئامرازێك بۆ خافلاندنی خەڵکیو، بەکوێنەکردنی مێشکان و، بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان و ووزە لەپێناو شتێکی وا کەسوودی نی یە.

● ئەمرۆ ئەو موسڵمانانە زۆرن کە شارەزایی یان لە ژیانی وەرزشکارو یاریزانەکان زیاترە وەك لە ژیانی هەر دە هاوەڵە موژدە پێ دراوەکە. ﴿العشرة المبشرين بالجنة﴾. جا ئەوانەی کە حاڵیان ئاوایە چۆن خۆیان بەموسڵمان تێ دەگەن، لە کاتێکدا کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لا تجدوا قوماً يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولوكانوا آباءهم أو أبناءهم أو أخوانهم أو عشيرتهم﴾ المجادلة -٢٢-.

جا ئەگەر نەگونجێ ئەو باوك و کورە کافرانە بخەبڵێنن، کە دژایەتی خواو پێغەمبەر دەکەن. چۆن دەبێ خۆشەویستی مان ببەخشینە ئەو کەسانەی کە رەنگە بەشۆرەت و ناوو دەنگەکەیان، بووینە ئامراز و چرنووکی دەستی کوفرو دژایەتی دینیان پێ بکرێت.

ئەمرۆ کە رەشۆکی هەرە مەزنی موسڵمانان، لە ئەرکی دۆستایەتی و دژایەتی بەپێی بەرنامەی راستی ئاینـەکـە، لارێ بوون و، دەستیان کردووە بە دۆستایەتی کردن و دژایەتی کردن، بەپێی چەندین دۆزی ساکارو لاوەکی و پووچ. کە زیاتر لە هەڵسوکەوتی منداڵانە دەچن، هەر ئەم جۆرە بیرو بۆچوونانەش، بوونە هۆی ئەم رۆژە پڕ لەزەلیل و مەهانەتەی کەتێی کەوتووین.

لە کاتێدا کە ئێمـە ئومەتێکین خوای گەورە ریزی گرتووین بە بە هەڵگرتنی پەیامی ئیسلام و، گەیانـدنی ئەم پەیامە پیرۆزەش ماندوو بوون و قوربانی دان و دەستەبەری یەکی تەواوی گەرەکە، لەگـەڵ ژیانێکی پڕ لە جۆش و خرۆش. چونکـە ئێمـە مەبـەست و ئامـرازو شێوازی گەیشتـنمان بەمەبەست کە، جودایە لە هەموو ئومەتە وێڵ و نزمەکانی تر، کە نوقمی ناوگێژاوی هەواو هەوەسن.

دوژمنـانی ئیسـلام، هەستـاون بەدرەکـردنی دۆزی دۆستـایەتی و دژایەتی کردن لەسـەر رێگا راستەقینەکەی بۆ بەرەو رێیەکی لاوازو پووچیان راماڵیوە. لە ئەنجامدا دڵی چەندین نەوەی (تەنیا ئەوانە نەبن کە خوا پاراستوونی) خالی کردووە: خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی هاوەڵانیو، شوینکەو توانیان و، زانا کارگەرەکان و، کتێبە زانستی یەکان و، خۆشەویستی هێزداری و هۆکارە راستەقینەکان

و، بەرەو خۆشویستنی دوژمنانی خواو، ئەو گۆتەپوچەڵ و، کردارە ناهەموارانەی کە خزمەتی ئەوان دەکەن، رایهاڵیون.

بۆ هیچ موسڵمانێك دروست نی یە، کە یاری بەك، یان کتێبێك، یان کەسێك، یا کۆمەڵە خەڵکێك، وەیا رژێمێکی دیاریکراو، یاخود رارەوێکی دیاریکراو، وەیان کارو کردەوەیەکی خۆش بوێ. ئەگەر لەوشتانە نەبێ کە خواو پێغەمبەر. پێ یان خۆشەو، دەبێ خۆشەویستی هەر شتێکیش لە خۆشەویستی ئەوان هەڵقوڵێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل أن كنتُم تحبُّونَ الله فَاتَّبِعُوني يُحْبِبكم الله ويغفر لكم ذنوبَكم والله غفورٌ رحيم ؛ قُل أطِيعُوا الله والرسُولَ فانْ تولَّوا فانَ الله لايُحبُّ الكافرينَ﴾ آل عمران ٣١-٣٢.

چونکە موسوڵمان بە حوکمی ئیمانەکەی بە خوای گەورە، هیچی خۆش ناوێ لە پێناو خوای گەورەدا نەبێ. رقی لە هیچیش نابێتەوە لەبەر خوای گەورە نەبێ. جاهەر یەکێکیش ئەو شتانەی خۆش بوێ، کەخواو پغیەمبەر خۆشیان دەوێو، رقیشی لەوشتانە بێ، کە خواو پێغەمبەر رقیان لێیە. ئەوا خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئایەتەکەی سەرەوەیە، لەگەڵ ئەو فەرمودەیەی کە دەڵێ: - ﴿من أحب لله وابغض لله واعطى لله ومنع لله. فقد استكمل الايمان﴾ صححه الالباني.

جا بەپێی ئەوشتانەی کەباس کران، مروفی موسڵمان هەموو کەسێکی صالحی خۆش دەوێ و دۆستایەتی یان دەکا. بە پێچهوانەشەوە، رقی لەو کەسانەیە کە لە ژێر فرمانی خواو پێغەمبەر دەرچوون و، دژایەتی یان دەکات.

ئەگەر ئیمەش موسڵمانی راستەقینە بین. ئەرکی سەرشانمانە کە بگەرێنەوە بوکتێبێ خواو سونەتی پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ و پیلانەکانیان وا دابرێژین، کە لەگەڵ مەبەستی دین و ئامانجەکانی ئۆمەتەکەمان بگونجێ و، دۆستایەتی و دژایەتی کردنیشمان بەپێی چەمکەکانی ئیسلام و بۆچوونە راستەکانی رێك بخەین.

# فەرموودە ناسی

## «پایەی سوننەت و ئیشەکانی لەبەرامبەر قورئاندا»

یەکەم: پایەی سوننەت:

تەواوی موسڵمانان کۆرا (ئیجماع)یان لەسەر ئەوەیە کە هەر گوفتار کردار و هەر بریاریکیش بە مەبەستی تەشریع و ئیقتیداء پێ کردن بێ و بە (صحیح)ی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ەوە هێنرابێتەوە، ئەوا لەدوای قورئاندا ئەویش سەرچاوەیەکی نەگۆری ئسلامەو بنچینەیەکە لە بنچینەکانی تەشریعی ئیسلامی، موجتەهید لەویشەوە حوکمە شەرعی یەکانی هەڵدەهێنجێ.

لەدینـدا بەزەروورەت زانـراوە کە قورئـانی پیرۆز یەکـەم سەرچـاوەی تەشریعی ئیسـلامی یە و، فەرمـوودەی (الحـدیث) پێغـەمبـەر ﴿ﷺ﴾یش سەرچـاوەیەکی دیکەو بنچینەیەکی دیکەیە لەدوای قورئاندا. بەڵگەو سەلمێنەریش لەم بارەیەوە لە قورئا... ـ سوونەتدا گەلێ زۆرن ئەو بەڵگانەش هەمووی ئەوە دەسەلمێنن کە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ لە هەموو گوفتار و کردار و بڕیارەکانی دا واجبە. ئەوانەش هەندێ لەم بەڵگانەن.

● «قُلْ اطيعُوا الله وَأطيعُوا الرسُولَ» نور (٥٤).

● «ياءايها الّذِين آمَنُوا أطيعُوا الله وَاطيعُوا الرسُولَ وَأولى الأمرِ منكم. فَانْ تنازعتم في شئ فردّوه الى الله والرسُولَ...» نساء (٥٩).

● فَلا وَربّكَ لايؤمنون حَتى يحكّمُوكَ فيما شَجر بَينهمَ ثُمّ لايجدوا في أنفسهمْ حرجاً مما قضيتَ وَيسلّموا تسليماً» نساء... (٦٥).

● «وَمَا آتاكم الرسُولَ فَخذوُه وَمَا نهاكمْ عَنه فَانتهوُا... حشر (٧).

● فَليحذَر الّذينَ يخالفُونَ عَنْ أمره أنْ تصيبهمَ فتنةٌ أوَ عَذابَ اليم» نور (٦٣).

هەروەها هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێ بێ لەدوای مردنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دا کۆڕایان لەسەر ئەوە بووە کە شوێنیکەوتنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ واجبە ئەوان ئەگەر شتێکیان لێ قەوما ـیەو بەسەرهاتێکیان لێ بەسـەر هاتباو لە قورئاندا حوکمی بەسەر هاتەکەیان وەدەست نەکەوتبایە ئەوا لەسوننەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دا سۆراغی حوکمی کەیان دەکرد. ئەگەر لەوێش وەدەستیان نەکەوتبایە ... ئەوا بەئیجماع وەیان بە ڕێگەی قیاسکردن ئیجتهادیان تێدا دەکرد. خەلیفەو شوێنکەوتوان و ئیمام و فەقیهەکانی ئیسلامی لە هەموو سەردەم و ڕۆژگارێکدا هەر لەسەر ئەم ڕێسایە ڕۆیشتوون.

★ ★ ★ ★

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئێمەی لەم جۆرە کەسانە وریا کردوتەوە، کە وا دەزانن تەنها قورئانیان بەسە، واتە سوننەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەرناگرن. دەفەرموێ ﴿ألا هل عسىٰ رجل يبلغه الحديث عني وهو متكئ على اريكته فيقول بيننا وبينكم كتاب فما وجدنا فيه حلالاً استحللناه وما وجدنا فيه حراماً حرمناه، وان ما حرم رسول الله كما حرّم الله الا أني أوتيت الكتاب ومثله معه﴾ رواه الترمذی ... عبـد الـبر دیـسـان لەم فەرمودەیەدا بۆمان دەردەکەوێت؛ سوننەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾یش سەر وەو بیچینەیەکی تەشریعی ئیسلامی یە و، وەرگرتن و کارپێکردن و شوێنکەوتنی واجبە، چونکە پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ هەر شتێکی فەرموبێ هەمووی لەخواوە وەرگرتووەو مەعصومە لەوەی هەڵەی تێدا کات ﴿وما ينطق عن الهوىٰ إن هو الا وحي يوحىٰ﴾ نجم (٣، ٤).

★ ★ ★

**دووەم: ئیشەکانی سوننەت.**

ئاشکـرایەو بەزەروورەت لەدینیدا زانراوە کە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ناردووەو کاری ڕوونکردنەوەکەشی بەو سپاردووە ﴿وانزلنا اليك الذكر لتبين للناس مانزل اليهم﴾ نحل (٤٤). لێرەوە دەزانین قورئانی پیرۆز چەند حوکم و بنچینەیەکی هێناوە کە دەبنە بنچینەکانی تەشریعی ئیسـلامی ڕوونکردنەوەو وردەکاری ئەو حوکم و بنچینانەش خوای گەورە بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ی سپاردووە.

ئیشی سونن ت یان تەقریر و تەئکید کردنی حوکمێکی قورئانەو، لە ئەنجامدا حوکمەکە دووسەرچاوەو دوو بەڵگەی بۆ دەبێ ـ لە قورئان و لەسووننەت ـ وە یان روونکەرەوەو را ٔکەری ئەو حوکمانەیەکە بە شێوی تێکرایی (اجمالي) هاتوون. وەیان موقەییەدکەری هەندی لەو حوکمانەیە کە قورئان بە موطلەقی فەرموویەتی، وەیان تایبەتمەند کەری (مخصص) دەبنە روونکەرەوەی مەبەستەکانی قورئان.

★ ★ ★ ★

کەواتە ئیشەکانی سوننەت بریتین لەمانە:

١ـ روونکردنەوەی تێکوایێتی (اجمال)ی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان: وەکو لەم ئایەتەدا ﴿واقیموا الصّلاة وآتوا الزکاة وارکعوا مع الراکعین﴾ بقرة (٤٣).

کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە «صحیح»ی لێ ی گێرداوەتەوە،ئەم ئایەتـە واتا تێکرایی‌یەی روونکردۆتەوە کاتەکانی نوێژ و ئەرج‌وچۆنیەتی‌یەکانی دیار کردووە. هەروەها لە زەکاتیش برو نوصابی بۆ زێر زیو و بەروبوم و ئاژەڵ و ئەمانە دیار کردووە، ئەمانە هەموو لە کتێبەکانی سوننەتی صحیح دا باسیان لێوە کراوە.

٢ـ ساغ کردنەوەی واتاکانی هەندێ ئایەت:هەروەها ئیشێکی دیکەی سوننەت ئەوەیە کە واتای هەندێ ئایەت راستەوخۆ دیار نی‌یە و ئەویش روونی دەکاتەوە، وەکو ئەم ئایەتە ﴿وکلوا واشربوا حتی یتبین لکم الخیط الابیض من الخیط الاسود من الفجر ثم اتموا الصیام الی اللیل﴾ البقرة ١٨٧. عەدێ کوری حاتەم (خ) مانای ئەم ئایەتەی بۆ روون نەبوەوەو بەشێوەیەکی دیکە تێی گەیشتبوو بۆیە کە ئایەتەکە دابەزی داوێکی سپی و داوێکی رەشی هێنا و لە کۆتایی شەودا لەگەڵ یەکی بەراورد ئەکرد تا بۆی دەرکەوێ کامیان سپی‌یەو کامیان رەشە. ئەمەی بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ گێراوە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێکەنی و فەرمووی ﴿انما هو سواد اللیل وبیاض النهار﴾ رواه البخاري.

٣ـ موقەییەد کردنی موطلەقەکان.

ئیشێکی دیکـەی سوننـەت ئەوەیە تەقییدی هەنـدێ ئایەت دەکات کە لە قورئاندا بە موطلەقی هاتوونە. وەکو ئەم ئایەت ﴿والسارق والسارقة فاقطعوا ایدیهما جزاءاً بما کسبا نکالاً من الله والله عزیز حکیم﴾ المائدة ـ٣٨ـ.

لێرەدا دەست (ید) بەمـوطلەقی هاتـووە، واتـە لەوانەیە تا مەچەك دەگرێتەوە، یان تا ئانیشك دەگرێتـەوە، بەڵام بەگـوێرەی سوننـەت وایە کە تا مەچـەك دەگرێتەوە. واتە لەمەچەك را دەستی دەبردرێت نەك لە ئانیشکەوە.

٤ـ تایبەتمەندکردنی گشتی‌یەکان (تخصیص العموم).

بۆ نموونە لەم ئایەتەدا ﴿الذین آمنوا ولم یلبسوا ایمانهم بظلم اولئك لهم الامن وهم مهتدون﴾ انعام ـ٨٣ـ.

ووشەی (ظلم) بە گشتی هاتووە بەڵام سوننەت روونی دەکاتەوە کە لێرەدا مەبەست لە (ظلم) پەیدا کردنی شرکە.

کە ئەم ئایەتەهاتە خوارەوە خەڵك تووشی شلەژان بوون و بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ یان گوت. ئەی پێغـەمبەری خوا! جا کەس هەیە زوڵمی لە خۆی نەکردبێ؟! ئەویش فەرمووی: ﴿انه لیس الذي تعنون الم تسمعوا ماقال العبد الصالح: ان الشرك لظلم عظیم انما هو الشرك﴾ متفق علیه.

٥ـ چەسپاندنی بنەمایێکی گشتی «تقریر مبدا عام».

زۆر بنـەمـا هەیە لە زۆران ئایەتی قورئاندا دەفامرێنەوە، سوننەتیش ئیشێکی دیکەی ئەوەیە ئەم بنـەمـایە بەرقەرار بکات و بچەسپێنێ وەکو ئەم فەرموودەی ﴿لاضرر ولاضرار﴾ ئەو بنەمایەی لەم

فەرموودەیەدا وەردەگیرێت بریتی یە لە زەرەر لێدانەوە ئەم بنەمایە لە هەندێ ئایەتی وەکو ئەم ئایەتەش ﴿ولا تمسكوهن ضرارا لتعتدوا﴾ دەفامرێتەوە.

**٦- یەکلا کردنەوەی ئەو حوکمانەی کەوتوونەتە نێوان حەلاڵ و حەرامەوە.**

بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿**أحل لكم صيد البحر وطعامه متاعا لكم وللسيارة**﴾ مائدة -.

-، هەروەها دەشفەرموێ: ﴿**حرمت عليكم الميتة...**﴾ مائده -٣-

لێرەدا حوکمی مردارە دەریاییەکان (ميتە البحر) هەم حەلاڵ و هەم حەرامیشی بەرکەوتووە. چونکە لە ئایەتی یەکەمدا لەبەر ئەوەی مردارکانی دەریا دەچنە ژێر باری راوی دەریایی یەوە بۆیە حەلاڵ دەبن. بەلام لە ئایەتی دووەمدا لەبەر ئەوەی دەچنە ژێر باری مردارەکان (ميتە)ەوە بۆیە حەرام دەبن.

لێرەدا پێغەمبەر -ﷺ- حوکمی مردارەکانی دەریا یەکلا دەکاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿**هو الطهور ماءه، الحل ميته**﴾ واتە: ئاوی دەریا خاوێنەو مرداربووەکانیشی حەلاڵن». هەروەها لە فەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێ ﴿**احلت لنا ميتتان و دمان: السمك والجراد، والكبد والطحال**﴾.

جراد = کللو.کبد= جەرگ.طحال = سپڵ (فاتە رەشە).

**٧- دووپات کردنەوەی حوکمێکی قورئانی.**

بۆنموونە لەم ئایەتەدا ﴿**ولا تاكلوا اموالكم بينكم بالباطل وتدلوا بها الى الحكام لتاكلوا فريقا من اموال الناس بالاثم وانتم تعلمون**﴾ بقرة -١٨٨-

خوای گەورە (بە ناهەق خواردنی ماڵی خەڵک)ی حەرام کردووە، وە کە تەماشای ئەم فەرموویەش دەکەین دەبینین هەمان واتای دووپات کردوتەوە. فەرموودەکەش ئەمەیە **لایحل مال امرئ مسلم الا بطيب نفس منه** رواه الدارقطنی.

**٨- زیاد کردنی هەندێ حوکمی دیکە.**

بۆ نموونە لە قورئاندا خوای گەورە نەهی ئەوە کردووە پیاوێك دوو خوشك بەیەکەوە بخوازێ و ببنە خێزانی ﴿**وان تجمعوا بين الاختين الا ما قد سلف**﴾ نساء -٢٣-.

بەلام لەسوونەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دا نەهی لەوەش کراوە کە کابرای بەژن ماموژنی خۆی یان خالۆژنی خۆیشی بهێنێ واتە نابێ ئافرەتێکی دیکە و ماموژنی خۆی یان خالۆژنی خۆی بەیەکەوە ببنە خێزانی، لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿**انكم ان فعلم ذلك قطعكم ارحامكم**﴾ رواه مسلم.

هەروەها لەبارەی ئارەق خواردنەوە لە قورئان تەنها نەهی لێکراوەو حەرام کراوە. بەلام لە سوننەتدا سزای بۆ ئارەق خۆرە کە داناوە.

★ ★ ★ ★

# بابەتی فیقهی

## ئەو شتانەی دەسنوێژ دەشکێنن

١- هەر شتێك لە پاش و پێشەوەی مرۆڤ بێتە دەرەوە، وەکو پیسایی و میزو تۆو (مني) و «وەدی»و

«وەذی». هەروەها ئەو شتانەش کە جاروبار دێنە دەرەوە وەکۆ کرم و خوێن و موو.
٢ـ دەرچوونی میزو پیسایی لە ڕێگەیەکی نائاسایی لەش، واتە لە دەرچەی خۆیانەوە نەبێ.
٣ـ لە هۆش نەمان.
أـ جگە لە نووستن، وەکو: شێت بوون و لە خۆبوون و سەرخۆش بوون زانایان لەسەر ئەم حاڵەتانە هاودەنگ (متفق)ن کە دەسنوێژ یان پێ دەشکێ.
ب ـ نووستن:
یەکەم: ئەگەر یەکێ بەراکشاوی نووستبێ ئەوا دەسنوێژەکەی دەشکێ، جا نوستنەکە زۆر بێ یان کەم.
دووەم؛ ئەگەر یەکێ بە دانیشتنەوە بخەوێ، ئەوا ئەگەر نووستنەکەی زۆر بێ دەسنوێژەکەی دەشکێنێ ئەوەش لەبەر ئەم فەرموودەیە: ﴿العین وکاء السّه فمن نام فلیتوضأ﴾ واتە: چاو (واگایی) قەپاغی کۆمی مرۆڤە بۆیە هەر کامێکتان نووستن، ئەوا دەسنوێژ بشۆنەوە» رواه ابو داود وغیره.
بەڵام ئەگەر نووستنەکەی کەم بێ ئەوا دەسنوێژەکەی ناشکێ، ئەمەش لەبەر ..و فەرموودەیەی کە ئەنەس ـ خ ـ دەڵێ ﴿کان اصحاب رسول الله ﷺ ینامون ثم یقومون فیصلون ولا یتوضئون﴾ رواه مسلم.
هەروەها ئەگەر یەکێك بە راوەستاویش بخەوێت، دەسنوێژەکەی ناشکێت بەڵام ئەگەر وەکو حاڵەتی کرنووش و سوژدە بردن بخوێت ئەوا دەسنوێژەکەی دەشکێ.
٤ـ هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام: دەسنوێژ بەوە دەشکێ ئەگەر موسڵمانێك لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، ئەوەش لەبەر ئەم ئایەتە: ﴿لئن أشرکتَ لیحبطنّ عملك﴾ «لیحبطن = بەتاڵ دەبێتەوە».
٥ـ ڕشانەوەی ئێجگار زۆر: ئەمەش لەبەر ئەم فەرموودەیەی کە ئەبو دەرداء ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەگێڕێتەوە وە دەڵێ: ﴿ان النبي ـ ﷺ ـ قاء فاتوضأ﴾ رواه الترمذي وصححه الالبانی.
«قاء = ڕشایەوە».
٦ـ دەستەکەوتن بە ئەندامی پێشەوە:
أـ دەستکەوتن بە زەکەر: ـ
یەکەم: دەسنوێژ دەشکێنێ. ئەمە رای ئیمام شافیعی و مەشهوری مەزهەبی ئیمام مالیك و ریوایەتێکی ئیمام «احمد»ە هەروەها گوتەی کۆمەڵێکی سەحابانیشە.
دووەم: چۆنیەتی دەستکەوتنەکە: چۆنیەتی‌یەکە بەم جۆرەیە کە بە ناو لەپی دەستی‌یەوە بێ و بێ ئەوەی هیچ پەردە (حائل) یان لە نێوان دابێ. واتە ڕاستەوخۆ ناولەپی دەستی بە زەکەری بکەوێت. ئەوەش لەبەر فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ﴿اذا أفضیٰ احدکم بیده الیٰ فرجه لیس بینهما حائل فلیتوضأ﴾ رواه الشافعي والدارقطني واحمد والبیهقي وابن حبان وغیرهم.
ب ـ دەستکەوتن بە کۆم «الدبر» ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەی پێشەوە.
٧ـ دەستکەوتنی ئافرەت بە فەرجی خۆی: ڕاسترەکەی وایە ئەگەر بەشەهوەت و بەڕووتی بێت (واتە هیچ پەردە یان لەبەین دا نەبێ) ئەوجا دەشکێ.
حەددی شەهوەتیش ئەوەیە مەذی بێتە خوارەوە.
٨ـ خواردنی گۆشتی ووشتر: ئەمەش لەبەر ئەو فەرموودەیە دەسنوێژ دەشکێنێ: ﴿سئل رسول الله ﷺ عن لحوم الأبل فقال: توضؤا منها. وسئل عن لحوم الغنم فقال لایتوضأ منها﴾ رواه مسلم.
٩ـ ئەگەر لەوە کەوتە گومان ئایا دەسنوێژ ی شکاوە یان نا؟ ئینجا ئەگەر لە پێشدا دەسنوێژ ی هەبووبێ ئەوا واحسێب دەکات دەسنوێژ ی ماوە. بەڵام ئەگەر لەپێشدا دەسنوێژ ی نەبووبێ ئەوا دەسنوێژەکەی نەماوە.

# خوشووشتن

## «الغسل»

ئەوشتانەی خۆشووشتن (غوسل لە خۆ دەرکردن) واجب دەکەن

١ـ تۆو (مەنی) :

أـ ئەگەر بەشەهوەتەوە دەربچێت، ئەوا خۆشوشتنەکە واجبە.

ب ـ ئەگەر بەبێ شەهوەت بێتە خوارەوە، بەهۆی سەرما و نەخۆشی. ئیمام شافیعی دەڵێ: واجبە، بەڵام گەلی زانایان (جمهور العلماء) و ئیبنو عەبباس دەڵێن: واجب نابێ، ئەم رایە راسترە (الارجح) مەنی پیاوان ئاوێکی خەست و بەفیچقەیە. هی ئافرەتانیش: ئاوێکی روونی زەردە.

٢ـ بەر یەککەوتنی هەردوو خەتەنەکراوەکان (التقاء الختانين) ئەم بەریەککەوتنە بەو جۆرەیە کە سەرکی زەکەری لە ناو فەرجدا بزربێ. جا تۆوی بێتەوە یان نا.

ئەمەش لەبەر ئەم فەرموودە ﴿اذا جلس بين شعبها الاربع ومس الختانُ الختان فقد وجب الغسل﴾ رواه البخاري لە ریوایەتی ئەوەش تێدایە «وان لم ينزل».

خۆ ئەگەر بەریەککەوتنەکە چوونەژوورەوەی تێدا نەبێ و تۆوی نەیەتەوە ئەوا غوسل واجب ناکات،

٣ـ موسڵمان بوونی کافر: ئەگەر کافرێك بێتە موسڵمان ئەوا لەسەری واجبە خۆی بشوات و غوسل لە خۆی دەربکات. لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە ئیبنو عاصم دەڵێ: ﴿اتيت النبي ﷺ اريد الاسلام فأمرني ان اغتسل بماء و سدر﴾ رواه النسائي واحمد وصححه الالباني.

٤ـ لە خوێنی بێ نوێژیی و زەیستانی دا «الحيض و النفاس» ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە بە فاطیمەی کچی حوبەیشی فەرموو ﴿دعي الصلاة قدر الايام التي كنتِ تحيضين فيها ثمّ اغتسلي وصلّي﴾ رواه البخاري.

# هەڵوێستی هەندێ لە زانایانی ئیسلام

ئەوەی کە گومانی تێدانی یە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن و زیتر لە خوا ترس و پتر خۆ پارێزن هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إنَّما يَخشى اللهَ مِنْ عِبادِهِ العلماءُ﴾ ٢٨ فاطر

بۆیە لەم بابەتەی بەردەست دا چمکێك نمونەی زیندوو دەهێنینەوە، لە ژیانی پیاوانێك کە ئیمان دڵی پر کردوون و، گوێیان بە پلەو پایەو سەڵتەنەت نەداوەو، هەرگیز سەریان بۆ هیچ زۆرداری و تۆغیانێك دانەواندووە. بەڵکو لە لوتکەی هێزو دەسترۆیشتنی زۆرداراندا، هەڵوێستیان هەبووەو بەرەنگارییان کردوون. لەگەڵ ئەوەی کە جگە لە چەکی بیروباوەر چی دیکەیان شك نەبردووە، بێگومان ئیمانداریش هەر بەم چەکە باڵا دەبێ و بەسەر هەموو چەکێکی تردا زاڵ دەبێت.

هەموو ئەو پیاوانە دەیانتوانی بەریگەو شێوازێکی جودا لەگەڵ قەوم و لەگەڵ فرمانرەواکانیان هەڵبکەن، ئەگەر چاویان لە ژیانی خۆش و ماڵ و سامانی فرە بووایە. وەك زانا خراپەکارو چەرچی یەکانی تاغوتان. بەڵام ئەوانە لەوە گەورەتربوون کە دونیا هەڵیانخەڵەتێنێ و هەوەس و گومان

ئۆقرەیان تێدا بگرێ. جا هەڵوێستی زانایان هێند زۆرن کە رەنگە لە ژمارنەیەن. بەلام تەنها تەنیا چەند وێنەیەك بۆیادکردنەوە دەهێنینەوە. یا داوەریش بە کەڵك ئیماندااران دێت. جا لە و هەڵوێستانەش :-

١- هەڵوێستی «سەعیدی کوری جوبێر» لەگەڵ «حەجاجدا» :

«سەعید کوری جوبیری ئەسەدی» یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی «ئیبنو عەباس خ. ر» و، لە پێشەوا بەرزەکانی ئیسلام بووە، لە «تەفسیر» و «فیقهـ» و، جۆرەکانی تری زانست و زۆری چاکەکاری‌دا (سەعید کوری جوبێر- ر-) بە توندی وەرەع و خۆپاریزی ناسرابوو. خاوەن زمانێکی پاراوو حەق بێژ بوو، دڵێکی پر زانستی هەبوو. وەلامی حازرو بەڵگەی بەتینی بەرامبەر ناحەزان دا لەلابوو. بەلام (حەجاج) بەخراپەکاری‌و دەستدرێژی کردن بۆ سەر ماڵ و گیانی خەڵکی دا ناسرابوو. بۆیە لە بوونی یەکێکی وەکو «سەعید کوری جوبێر» لە ناو خەڵکەکەی دا دەترسا. چونکە هەموو خۆشیان دەویست و متمانەیان پێ‌ی هەبوو. بۆیە بریاری‌دا خۆی لێ دەربازکا بەشێوازەکانی هاندان و تۆقاندن (ترغیب و ترهیب).

ئەوەبوو (سەعید)یان هێنایە لای (حەجاج). «حەجاج» چەند پرسیارێکی لێ کرد کە پربوون لە گاڵتە پێ کردن و بەکەم زانین. ئەویش وەلامی زۆر توند و بەجێ‌ی دانەوە.

پاشان «حەجاج» فرمانی کرد دەفرێکی پر مرواری و دورو یاقوتیان هێناو خستنیە بەردەست «سەعیدی کوری جوبێر». بەڵکو دەمی پێ گەرم بکاو خۆ کرکردن و زمان گرتنی «سەعید»ی پێ بکرێ. بەلام «سەعید» هەستی بەو مەبەستەی کرد و بە «حەجاج»ی گوت :- ئەگەر ئەم سامانەت بۆ هەندێ خر کردۆتەوە کە خۆتی پێ لە ترسی رۆژی دوایی بپارێزی ئەوا چاکە. ئەگەر نا ئەوا هەر ترسێکی ئەو رۆژە وا لە دایکی شیردەر دەکا کە کۆرپـە شیرەخـۆرەکەی لە بیر بکاو، خێر لە هیچ شتێکیش نی‌یە بۆ دونیا کە باش و پاك نەبێ.

ئەم دەم گەرم کردنەی کە «حەجاج» بەم هەموو سامان و زێرەکردی بە کەڵکی نەهات. چونکە «ئیبنو جوبێر» نەلە ماڵ پەرستان بوو. نە لەوانەی کە دینیان بە دونیا دەفرۆشت. بۆیە «حەجاج» لە «سەعید» بێزار بوو و، پێ‌ی گوت : - «سەعید» هەلبژێرە، بەچ شێوازێك بتکوژم؟ «سەعید» پێ‌ی گوت :- تۆ بۆ خۆتی هەلبژێرە سوێندم بەخوا، هەر چۆنم بکوژی، خوای گەورە ئاوات دەتکوژێتەوە لەرۆژی دوایی. گوتی :- دەتەوێ کەلێت ببورم؟ گوتی :- ئەگەر لێبوردن بێ ئەوا لە خواوەیە. بەلام تۆ هیچ پاکانە و هەنجەتێکت نی‌یە.

«حەجاج» فرمانی دا گۆشاو گۆش سەریان بری زمانیشی هەر تەربوو بەیادی خودا. جارێکیش بە «حەسەنی بەسری - ر -»یان گوت : «حەجاج» «سەعید کوری جوبێر»ی کوشت.

گوتی :- (خودایە تۆمان هەیە بۆ سەر بەدکارەکەی «ئەقیف» سوێند بە خوا، ئەگەر چی لە نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوادا هەیە، لە کوشتنی ئەو پیاوە هاوبەش بن، خوایی باڵادەست تێکرا دەیانخاتە دۆزەخ. «ئەحمەدی کوری حەمبەل - ر -»یش دەلێ :- (حەجاج) «سەعیدی کوری جوبێر»ی کوشت. لە کاتێکدا کەچی لەسەر رووی زەوی هەیە. پێویست بەزانستی ئەو کابرایە بوو.

٢- هەڵوێستی (ئیمامی ئەحمەد - ر -) لە سەرخستنی سونەت دا کاتێك کە (مەئمون) پشتگیری لە موعتەزیلەکان کرد، دژی ئەهلی سونەت و جەماعەت. لە مەسەلەی گۆتن بە خەلقی قورئان لەو کاتەدا (ئیمام ئەحمەد - ر -)ی سەرخەری سونەت دوژمنی بیدعە، وەکو شاخێکی سەرکەش، بێ

گوێ دانە هیچ جۆرە تۆقاندن و ترساندنێك. وەك پەلوانێکی هەڵوێست بەرز لە بەرامبەریان دا راوەستا بەشێوەیەك کە تەنانەت هەندێ لە قوتابی و خزم و کەسانی، داخیان بۆ دەخوارد. ئەوەبوو جارێك «ئیسحاق»ی مامی هاتە لای و پێی گوت:- یا ابا عبدالله، قد اجاب اصحابك. وقد اعذرْت فيما بينك وبين الله، وبقيت انت في الحبس والضيق (باوکی عەبدوڵلا) ئەوا هەموو هاوەڵەکانت لەم شتە بێ دەنگ بوون،، تۆش عوزرت بۆ نێوان خۆت و خودا هەیە. لەگەڵ ئەوەش بە تەنیا لە تەکی زینداندا ماویتەوە.

گوتی:- ﴿یاعم اذا اجاب العالم تقية، والجاهل بجهل فمتیٰ يتبين الحق﴾ واتە: (مامە گیان، ئەگەر زانا بە توقینەو، نەزانیش بە نەزانی وەڵامی دایەوە. کەینێ حەق رون دەبێتەوە.

٣- ئیمام ئەبو حەنیفە - ر -

کاتێك کە «ئیمام ئەبو حەنیفە - ر -» لە زینداندا دابوو. پاش ئەوەی کە بەفرمانی «ئەبو جەعفەری مەنسور» لێیان دابوو و ئازاریان دابوو. دایکی چووە سەردانی لە زیندانی و پێی گوت:- ﴿یا نعمان ان علماً ما افادك غير الضرب والحبس لحقيق بك ان لتنفر عنه﴾ لە وەڵامدا بەدایکی گوت:- ﴿یا اماه لو اردت الدنيا لوصلت اليها، ولكني اردت ان يعلم الله اني صنت العلم ولم اعرض نفسي فيه للهلكة﴾.

٤- هەڵوێستی (عیززی کوری عەبدولسەلام) لەگەڵ (شا ئەیوبی ساڵح دا)

هەڵوێستی ئەم زانایە بەرزە بەرانبەر ئەو پادشایە، کە شای (میسر) بوو. بەندێکە بۆ ئەوانەی کە جگە لە خوا، لە کەس ناترسن.

جارێك «شا ئەیوبی ساڵح» «شێخ عەبدولعەزیزی کوری عەبدو لسەلامی) ناسراو بە (عیززی کوری عەبدولسەلام) داوەت کردو شێخ بووە میوانی لە (میسر)دا. لە دوای ئەوەی کە پێشتر لە (شام) دەرکرا بوو.

جا رۆژێکیان «ئەیوب شا» لە مەجلیسێك دابوو. هەر چوار دەوری بە ئەمیرو فرمانرەوایان درابوو. خەڵکێشی چین چین دەهاتنە لاو، دەستیان ماچ دەکردو، ملیان بۆ کەچ دەکردو، سەریان بۆ دادەنواند، بەشێوازێکی وا، کە زەلیلی و مل کەچی بۆ جگە لە خوا پیشان دەدا. لەناو ئەو حەشاماتەیدا «عیززی کوری عەبدولسلام» ویزەکانی بری و هاتە پێش و بەهێزی ئیماندارێك و توانای یەکتاپەرستێك:- بە زووی پاشادا هاواری کرد:- «بۆچی مەی (خمر) لە سەردەمی تودا دەفرۆشرێ و، تۆش لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەدا خافڵاوی؟) پاشا هیچی لەوە زیاتر پێ نەما کە بە نەرمی یەوە داوای لێبووردنی لێ بکاو و پێی بڵێ:- من بەمەم نەزانیوە... رەنگە لە سەردەمی باوکم بووبێ.

بەڵام «عیززی کوری عەبدولسەلام» زۆر توندتر دووبارەی کردەوەو گوتی: لەوانە زیاترت نەگوتووە کە دەڵێن:- ﴿ان وجدنا اباء نا على امة وانا على آثارهم مقتدون﴾ الزخرف -٢٣-

لێرەدا پاشا فەرمانی داخستنی ئەو مەیخانەیە دەدات. پاشان یەکێك لە نزیکەکانی پاشا، کە سەرسام بووە بە جورئەتی شێخ لەسەر حەق. بەرامبەر ئەو هەموو خەڵکە، لێی دەپرسێ:- ئەرێ تۆ لێی نەترسای؟ شێخ گوتی:- سوێند بەخوا، کورەکەم. کاتێ کە بیرم لە هەیبەتی خوای باڵادەست کردەوە، پاشام لە بەرچاو وەکو پشیەیەکی بچووك لێ هات.

٥- شێخ ئیبنو تەیمیە (ر)

کاتێك شێخەلیسلام لە زیندان دابوو. چەند برایەکی نامەیەکیان بۆ هەناردو، ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد، کە نەزم کیش بێ لەگەل نەیارەکانی دا. تاکو لە زیندانەکەی دەرباز بێ. بەلام (ئیبنو تەیمیە - ر -) هەلویستی مەردانەی خۆی پاراست و لە نامەیەکی دا وەلامی داوەو گوتی: ﴿اما بعد فقد وصلت الورقة التي ذكر فيها الشيخان الناسكان ما ذكرا، جعلها الله من الائمة المتقين الذين جمعوا بين الصبر ولاتقان، وعلموا ان الله ناصر حزبه ومنجز وعده، ومنتقم من حزب الشيطان لعباد الرحمن. ولكن بما اقتضت حكمته ومضت به سنته، من الابتلاء والامتحان الذي يميز الله به اهل الصدق والايمان من اهل النفاق والبهتان﴾ قال تعالى: - ﴿الم احسب الناس ان يتركوا ان يقولوا آمنا وهم لايفتؤن ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين﴾ العنكبوت

# بۆ خوشکان

## مال... یا مندال...؟

نووسینی: - ام عبدالرحمن

وەرگێرانی: - دایکی نور

﴿والعصر ان الانسان لفي خسر الا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر﴾. سورة العصر

ئەم ئایەتە پیرۆزانە، لەوە ئاگادارمان دەکەنەوە، کەبردنەوەو سەرکەوتنی مرۆڤ بەدەست نایێ بە هەبوونی ئەم چوار سیفەتانە نەبێ: -

١- ئیمان

٢- چاکەکاری (العمل الصالح)

٣- راسپێری بەحەق خوازی (التواصي بالحق)

٤- راسپێری بە ئارامگری (التواصي بالصبر)

هەروەها پیویستە ئەم چوار سیفەتە بە تیکرایی وەربگیرێن. نەك وەرگرتنی لایەنێك و جێ هێشتنی یەکیکی تر. چونکە هەبوونی ئەم چوار سیفەتە بە یەکەوە، دروشمی ئیمانداری سەرکەوتووە.

ئەگەر ئەمەش وەدی نەهات. مانای دۆران وزیان لێ کەوتنە. جا لە روانگەی ئەم مانایەوەو، بەپێی واتاکانی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: - ﴿والمؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله اولئك سيرحمهم الله ان الله عزيز حكيم﴾ التوبة (٧١)

جا بویە حەز دەکەین چەند تیبینیو سەرنجێك دەربرین، کە پەیوەستن بەکرۆکی راسپێری بە حەق خوازی و راسپێری بە ئارامگری و، بەشکین لە - فرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە کردن. جابە پشتیوانی خوای گەورە دەلیم: -

● سەرنجی یەکەم:ـ
بەداخەوە هەندێك لە خوشكانمان بەدی دەكەین، كە هەموو خەم و گرنگی پێدانی خۆیان بە پاك كردنەوەو ڕێكخستنی ماڵەكانیان بەخشیوە. بێگومان ئەمەش عەیب و نەقوستانی‌یەك نی‌یە، ئەگەر كارەكە هەر ئەوەندە بێ چاكە، بەلاَم جگە لەم وێنەیە هی تریشمان بەرچاو دەكەوێ.
خوشكەكەمان دەبینین كە هەموو كاتی خۆی بە خەریك بوون بەماڵەوە بەسەر بردووە. بێ ئەوەی هیچ گرنگی بدات بە پەروەردەكردنی منداڵەكانی. لەوانەشە ئەگەر منداڵەكەی شتێكی لێ كەوتە سەرزەوی و پیسی كرد، یان دەرگەی سەلاجەكەی كردەوە، یا هەر ئیشێكی تری چوكەلەی لە دەست روویدا. بەڕای ئەو خوشكە وایێ كە منداڵەكەی شایانی شكاندنەوەو قسە پێ گوتن و لێدانە:
پرسیاری ئێمەش لێرەدا ئەوەیە:ـ ئایا خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی هیچ موحاسەبەیەكی ئەو دایكە دەكات، لەسەر پیس بوونی زەوی، یان كرانەوەی دەرگای سەلاجەكەی ماڵیان؟ ئەی منداڵ راسپاردەنی بەلای ئەو دایكە؟ هەر ئەویش لێپرسراوی پەروەردەو پێگەیاندنی نی‌یە لەسەر پێرەوێكی ساڵحانە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:ـ ﴿الا كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، فالامير الذي على الناس راع، ومسؤول عن رعيته، والرجل راع على اهل بيته و مسؤول عن رعيته. و المرأة راعية في بيت زوجها وولده وهي مسؤولة عنهم، والعبد راع على مال سيده وهو مسؤول﴾ متفق عليه.

هەروەها لە «ئەبو مەسعودی بەدری ـ خ ـەوە:ـ (كنت اضرب غلاماً لي «وبالسوط فسمعت صوتاً من خلفي «اعلم ابا مسعود» فلم افهم الصوت من الغضب. فلما دنا مني اذا هو رسول الله ﷺ. فاذا هو يقول:ـ ﴿اعلم ابا مسعود ان الله اقدر عليك منك على هذا الغلام﴾ فقلت:ـ ﴿يارسول الله، هو حر لوجه الله تعالى﴾ فقال:ـ ﴿اما لو لم تفعل للفحتك النار، او المستك النار﴾ رواه مسلم
ئەگەر (ئەبو مەسعود) كە هاوەڵێكی پایەبەرزە، لە ئاگردا بسوتێ بە هۆی لێدانی گویلەیەكی، دەبێ ئێمە چۆن بین لە هەلسوكەوت كردندا، بەرامبەر منداڵەكانمان. جا ئەو ئامۆژگاری‌یە چی‌یە كە دەبێ ئاڵ و گۆری بكەین لە پێناو ترسی خۆمان لەو چارەنوسە بە ئازارەو، وەك بەزەیی‌یەك بە جگەر گۆشەكانمان لەوە چاكترمان بەدەست ناكەوێ بلێین:ـ با هەموومان لە خوا بترسین و خۆپارێز بین...
خوشكی ئازیزمان:ـ هەندێ لە ئەهلی عیلم دەلێن؛ ئەركی ژن بریتی‌یە لە هەتكرتنی سك و پەروەردەكردنی منداڵ و، گوێرایەڵی كردنی مێردەكەی لە چاكەدا. ئەوەی پەیوەستیشە بە ماڵ و كاروباری ماڵ ئەوا پیاوەكە پێویستە یارمەتی بدات. وە لە باتی ئەو كاروبارانەی كە ئافرەت لە ماڵەوەش جێبەجێیان دەكات پاداشتی سونەتی (نوافل) هەیە.
ئەو ئاینە مەزنەی ئێمە ئافرەت لە پلەو پایەكی زۆرەبەرزوورو باڵا دادەنێت كە بریتی‌یە لە پەروەردەكردنی نەوەكان و پێگەیاندنی پیاوان. چیمان لێ هاتووە وا خێرو چاكە دەگۆڕینەوە بە كاری بچووك و نزم؟! و خۆمان بەسونەتان خەریك دەكەین (كە كارو باری ماڵە)و، فەرزەكان لە بیردەكەین (كە ئەركی پەروەردەو پێگەیاندنی). زۆرجار دەبینین خوشكەكەمان دڵی لە منداڵەكانی تەنگ دەبێ و بێزار دەبێ بەهۆی ئەوەی كە یەكێكیان دەفرێك دەشكێنێ، یان جل و بەرگی خۆی پیس دەكا یان... هتد.
جا خۆزگە بەوە دەخوازێ كە خوا منداڵی پێ نەبەخشێ‌وایە! وە دەڵێ:ـ ئای كە فلانە ژن خۆشبەختە، چونكە هیچ منداڵی نی‌یە؛..، چی‌دیكە منداڵم ناوێن!!.

ئایا ئەو خوشکەمان پێی لەوە ناکاتەوە، کە جارێك خوای گەورە تاقی بکاتەوەو، منداڵێکی لێ بستێنێ. ئایا ئەو کات دڵشاد دەبێ ... یان پەژیوان دەبێتەوەو دەگری و دڵی تەنگە دەبێ..؟ ..

گەلێك جاریش نەفرەت و تووك دوعا لە خۆی و منداڵەکەی دەکا، لەکاتێکدا کە پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾، نەهی لەم کارەکردووە.

لە (جابیری کوری عەبدوللا - خ -)وە دەڵێ:- پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:- ﴿لا تدعوا علیٰ انفسکم ولا تدعوا علیٰ اولادکم، ولا تدعوا علیٰ خدمك، لا توافقوا من الله ساعة یسأل فیها عطاءً فیستجیب لکم﴾ رواه مسلم وابو داود.

هەروەها لە (ئیبنو عومەر - خ -)وە هاتووە کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:- ﴿یا معشر النساء تصدقن واکثر من الاستغفار فاني رایتکن اکثر اهل النار﴾.

ژنێك لێی پرسی:- (مالنا اکثر اهل النار)؟

فەرمووی:- ﴿تکثرن اللعن وتکفر العشیر﴾ رواه ملسم دیسان لە (ئەبو دەرداء - خ. ر)وە. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:- ﴿ان العبد اذا لعن شیئاً صعدت اللعنة الیٰ السماء فتغلق ابواب السماء دونها ثم تهبط الیٰ الارض فتغلق ابوابها دونها ثم تاخذ یمیناً وشمالاً فان لم تجد مساغاً رجعت الیٰ الذي لعن فان کان اهلاً، والا رجعت الیٰ قائلها﴾ رواه ابو داود مساغاً:- واتە دەرچەیەك.

ربعتْ الیٰ الذي لعن انکان اهلاً:- دەچێتە لای ئەو کەسەی کە لەعنەتەکەی لێکراوە. جا ئەگەر شایانی توورەبوونی خودا بوو، بەهۆی عاسێ بوونی. والا رجعت الیٰ قائلها:- ئەگەر نەفرەت لێکراوەکە پیاوچاك بوو. ئەوا ئەو نەفرەتە دەگەڕێتەوە سەر نەفرەت کارەکە. دەبێ بزانین کە نەفرەت (لەعنەت)یش مانای دوورخستنەوەو دەرکردنە لە رەحمەتی خوای گەورە...!!

سەرنجی دووەم:- وێنەیەکی دیهان دێتەوە بەر چاوا :- خوشکێکی سك پڕ دەبینین کە نوژدارەکان ئامۆژگارییان کردووە، بەکەمی جوولەو، بە هەسانەوە. دەبینین ئەویش سەتڵەکەی دەست داوەتێ و خەریکی سڕینی ماڵەکەیەو ئەو شتە گران و بەسەنگانە هەڵدەگرێ و، دەیانگوازێتەوە کە رێ بە ئیشەکەی دەگرن. ئەگەر پێشی گوترا:- دەترسێین ئەم کارەت کاریگەریەکی خراپی هەبێ لەسەر خۆت کورپەلەکەی سکت. (بەتایبەتی ئەگەر ماڵەکە پاك بێ و پێویستی بە سڕین و شۆرین نەبێ)

دە :- ناتوانم دانیشم و زەوی‌یەکەش نەسڕاوەتەوە باشە ئەدی ئەو راسپاردەیەی کە لە سکتا هەڵت گرتووە منیش لە خۆم دەپرسم:- ئایا ئەگەر ئەو کۆرپەلەیە لە بار چوو، یان بە مردوویی لە دایك بوو؛ خوێنی ئاکەوێتە مل ئەو دایکە بە هۆی کوشتنی هەڵە. یان ئەم کوشتنە بەهەڵە نی‌یە؟

وەك ئیسلام فێری کردووین؛ منداڵەکانمان لێپرسراویتیت و تاقی‌کردنەوەو ئەزموونن لە خوای گەورەو. هەروەك دەفەرموێ:- ﴿یا ایها الذین امنوا ان من ازواجکم و اولادکم عدواً لکم فاحذروهم، وان تعفوا وتصفحوا وتغفروا فان الله غفور رحیم انما اموالکم واولادکم فتنه، والله عنده اجر عظیم، فاتقو الله ما استطعتم . واسمعوا واطیعوا وانفقوا خیراً لانفسکم، ومن یوق شح نفسه فاولئك هم المفلحون﴾ التغابن ١٤-١٦

واتە؛ ئێمە دەبێ لە سەرەتادا:-

١- تەقوای خوامان هەبێ لە جگەر گۆشەکانمان بەشێواز کە خوای گەورە فەرمانی پێ‌کردین و، لەسەر ئیمان وئیسلام پێ‌یان بگەیەنین.

٢- ئاگادار بین لەکەم و کورتی و فەوتاندنی ئەو ئەمانەتە، نەوەك تووشی لێپرسینەوە بین لە دوا رۆژ دا لە بەردەم خوای گەورە.

٣ـ نابێ سۆزو عاتیفه رامان پێچێ و بکەوینه گوناهان . وەکو ئەوەی که منالەکان پشت گوێ بخەین و تەنانەت لەسەر نوێژکردنیش لێیان نەپێچینەوەو حسێب و کتێبیان لەگەڵ دانەکەین .
٤ـ دەبێ لەوەش ئاگادر بین که خەریك بوون به منداڵەکانمان فەرزو و ئەرکەکانمان لەبیر نەبەنەوە، له نوێژ و یادی خوداو ئەوانی تر. و تووشی زەرەرو زیان بین و. . . هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ
﴿یـاایهـا الـذین آمنـوا لاتلهکم اموالکم ولا اولادکم عن ذکر الله، ومن یفعل ذلك فاؤلئك هم الخاسرون﴾ المنافقون (٩)

هەروەها منداڵ نیعمەتێکه که خودای کەورە ژیانی پێ رازاندوّتەوە هەر چەندی سەیری ئەو رووە بێ تـاوانـانه بکەین دڵمان خۆش دەبێ و کامەرانی ژیانمان دادەگرێ.. بەڵێ نیعمەتێکی گەورەیە که شایانی سوپاسێکی بێ پایانه بۆ خودای بالادەست و بەبەزەیی. . . چەندیشن ئەوانەی که خوای گەورە بەبێ بەش بوون لەم نیعمەتە تاقی یان دەکاتەوە؟ . .

پاشانیش قورئان ئەوەمان دێنێتەوە یاد . کەمنداڵ تاکه ئامانج نی یە بۆی هەوڵ دەین. بەڵکو رۆژی دوایی و، پاشماوەی چاك (الباقیات الصالحات) مایەی هیواو خێرو پاداشتن . هەروەك دەفەرموێ :ـ ﴿المال والبنون زینة الحیاة الدینا، والباقیات الصالحالت خیر عند ربك ثواباً وخیر املاً﴾ الکهف

ئەگـەر کاتێکیش هات و جگـەر گۆشـەیەکیشمان له دەست چوو. دەبێ بڵێین (ان لله وانا الیه راجعون) و، زۆر سوپاسی خودا بکەین تاکو له پاداشت دا خانوێك له بەهەشت وەرگرین . هەروەك پێغـەمبـەر ﴿ﷺ﴾ پێمانی راگـەیانـدووە. کاتێك دەفەرموێ :ـ ﴿اذا مات ولد العبد قال الله تعالیٰ لملائکته :ـ «قبضتم ولد عبدي» فیقول :ـ «نعم». فیقول :ـ «قبضتم ثمرة فؤاده» فیقولون :ـ «نعم» فیقول :ـ «ماذا قال عبدي؟» فیقولون :ـ «حمدك واسترجع» فیقول الله تعالیٰ :ـ «ابنوا العبدي بیتاً في الجنة سموه بیت الحمد»﴾ رواه الترمذي وقال حدیث حسن

هەروەها دەبێ له خوا بپارێینەوە که به ئەوەی چاکترمان پێ ببەخشی . هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فێری کردووین . له (ئومموسەلەمە) وە دەڵێ :ـ گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو:ـ ﴿مامن عبد تصیبه مصیبة فیقول ـ انالله وانا الیه راجعون ـ اللهم اجرني في مصیبتي واخلف لي خیراً منها، الا اجره الله تعالیٰ في مصیبته واخلف له خیراً منها﴾ رواه مسلم .

لەخوا دەپارێینەوە که منداڵی سالحمان پێ ببەخشی . هەروەك لەسەر زاری (ئیبراهیم پێغەمبەر ـ ع ـ) فێری کردووین :ـ (رب هب لي من الصالحین) الصافات ١٠٠ .

لەسەر زمانی (زەکەریا ـ ع ـ)یش که دەفەرموی (رب هب لي من لذلك ذریة طیبة انك سمیع الدعـ..) ال عمران ٣٨

هەروەهـا لەسـەر زمـانی خوا پەرستانیش. هەروەك دەفەرموی :ـ ﴿ ربنا هب لنا من ازواجنا وذریا[illegible]ة اعین، واجعلنا للمتقین اماماً﴾ الفرقان ٧٤

جاومان لێیە که خودای گەورە له بەخشندەیی و رەحمەتی خۆیمان پێ ببەخشێ و. منداڵەکانمان چاك [illegible] باڵپشتمان بن له دین و دونیامان داو، له کاتی پیریمان دا به کەلکمان بێن و، له پاش مردنمان دوعام[illegible]ـو بکەن و. پلەو پایەمان پێیان بەرزبێتەوە له بەهەشت دا . پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ :ـ ﴿اذا مات ابن آدم انقطع عمله الا من ثلاث :ـ صدقة جاریة او علم ینتفع به . او ولد صالح یدعوا له﴾ رواه مسلم .

هەروەهـا دەفـەرمـووێ :ـ ﴿ان الـرجل لترفع درجته في الجنة فیقول :ـ اني لي هذا؟ فیقال :ـ باستغفار ولدك لك﴾ رواه احمد في المسند .

# خواناسین

پیاوچاکان لە بارەی خواناسیەوە بەگوێرەی نیشانەو شوێنەوارەکانیەوە لێی دواون و پێناسەیان کردووە.

١ـ هەندێکیان گوتویانە: یەکێك لەنیشانەکانی خواناسین ترسانە لە خوا، چونکە هەر کەسێ تا زیاتر خوا بناسێ ئەوەندە زیاتر لەخوا دەترسێت.

٢ـ هەروەها گوتویان: ناسین خوا دلئارامی (السكينة) وەدی دێنێ، جا هەر کەسێ تا ناسینەکەی زیاتر بێ ئەوەندە زیاتر دلئارام دەبێ.

٣ـ ئیبنو لقەییم دەلێ: نیشانەی خواناسین ئەوەیە کە دلّ بە خواوە خۆش ببێ واش هەست بکات بە دلّ زۆر لەخوا نزیکەو خواش زۆر لەو نزیکە.

٤ـ ئەحمەدی کوری عاصم دەلێ:ـ ئەوەی زیاتر لەخوا بترسێ ئەو خواناسترە. ئەم ئایەت و فەرموودەیەش ئەم قسەیە پەسند دەکەن: ﴿انما يخشى الله من عباده العلماء﴾، ﴿انا اعرفكم بالله واشدكم له خشية﴾.

٥ـ هەندێکی دی گوتویانە، هەر کەسێ خوا بناسێ، ژین فراوان و ژیان ئاوەدان دەبێ. سامی لەسەر هەموو شتێکدا دەبێ، ترسی لە کەس نامێنێ، دلّی بەخواوە ئاسوودە دەبێ.

٦ـ هەندێکی دیش گوتویانە: هەر کەسێ خوا بناسێ، دلّی بە خواوە شادو گەش دەبێ، بە مردن شادمان دەبێ، کە خەلك دەبینن دلخوش دەبن، بەلام هەرکەسێ خوای نەناسێ دلخەفەتباری دونیایە ئەوەی خوا بناسێ دلّی تەنها بەلای خواوە دەبێ و هەر خوای مەبەستە، بۆیە هەر یەکێ خۆی بە خواناس دابنێ و مەبەستی غەیری خواشی لە دلدا بێ، ئەوا درۆی لەگەلّ خۆدا کردووە.

ئەوەی خوای ناسیوە، بەقەد ناسینەکەی خوای خۆش دەوێ، لێی دەترسێ و تکای لێ دەکات، پشتی پێ دەبەستێ داوای تۆبەی لێ دەکات، زمانی بە یادکردنەوەی تەر دەبێ، تامەزرۆی دیتنیەتی، شەرمی لێ دەکات، بە ئەندازەی ناسینەکەی بەگەورەو مەزنی دەزانێ.